# چۆن نوێژ دەکەیت؟

## وەك پێغەمبەر ﷺ

ئامادەکردن :

محمد نوري
علي تحسين

پێداچوونەوە :

د. عبداللطيف أحمد

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله:

**خوێنەری بەڕێز:**

ئەم نامیلکەیەی بەردەستت (**چۆن نوێژ دەکەیت وەك پێغەمبەر**ﷺ) نوسینی مامۆستا محمد نوری و مامۆستا علی تحسین ، نامیلکەیەکی بەسود و گرنگە مناڵەکانمانی لەسەر فێربکەین و پەروەردەیان بکەین. خوا پاداشتی خێریان بداتەوە.

والحمد لله رب العالمين

**د. عبداللطيف أحمد**

٢٢ / شوال / ١٤٣٩هـ
٦ / ٧ / ٢٠١٨ م

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله ،

خوێنەری بەڕێز :

ئەم نامیلکەیەی بەر دەستت (چۆن نوێژ دەکەیت وەك
پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام) نوسینی مامۆستا
محمد نوری و مامۆستا علی تحسین ، نامیلکەیەکی
بەسود و گرنگە مناڵەکانمانی لەسەر فێربکەین و
پەروەردەیان بکەین . خوا پاداشتی خێریان بداتەوە
والحمد لله رب العالمین

د. عبداللطیف أحمد عبداللطیف

٢٢/ شوال / ١٤٣٩ هـ

# پێنج بنچینەکەی ئیسلام

لا إله إلا الله
محمد رسول الله

**١ شایەتی دان** (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدًا رسول الله).



**٢ نوێژکردن** (بەیانی - نیوەڕۆ - عەسر - ئێوارە - خەوتنان).



**٣ زەکات دان** کاتێك لەسەرت واجب دەبێت.



**٤ ڕۆژوو گرتن** لە مانگی ڕەمەزاندا.



**٥ حەج کردن** ئەگەر توانات هەبێت.

## بەڵگە

کاتێك جبریل ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەرمان ﷺ کرد و پێی فەرموو:
ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئیسلام.
پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی:

(( الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا )) [مسلم ٨]

واتە:

(ئیسلام ئەوەیە کە:
١ - شایەتی بدەیت کە : جگە لە (الله) ؛ هیچ پەرستراوێکی تر شایەنی پەرستن نییە، وە کە موحەممەد ﷺ نێردراوی خوایە. ٢-وە نوێژبکەیت.٣- وە زەکات بدەیت.
٤- وە لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو بیت. ٥- وە حەج بکەیت ئەگەر توانات هەبێت.)

# شەش بنچینەكەی **باوەڕ**

باوەڕهێنان بە:

| | | |
|---|---|---|
| ١ پەروەردگار | كە: تاك و تەنهایە و هیچ هاوەڵێكی نییە. | الله جَلَّ جَلَالُه |
| ٢ فریشتەكان | ئەوانەی كە: دەیاننناسین و نایانناسین. | الملائكة |
| ٣ پەرتووكەكان | ئەوانەی كە: بۆ پێغەمبەران دابەزێندراون. | الكتب |
| ٤ پێغەمبەران | هەموویان: بە بێ جیاوازی. | الرسل |
| ٥ ڕۆژی دوایی | لە: ژیانی بەرزەخ تا: بەهەشت و دۆزەخ. | اليوم الآخر |
| ٦ قەدەر | خۆشی و ناخۆشییەكانی. | القدر |

## بەڵگە

تەواوكەری فەرموودەی پێشوو:

(قَالَ : فَأَخْبِرْنِي عَنِ الْإِيمَانِ. قَالَ : أَنْ تُؤْمِنَ بِاللّٰهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، خَيْرِهِ وَشَرِّهِ )[مسلم ٨]

واتە:

(جبریل ﷺ پێی فەرموو: **هەواڵم پێ بدە دەربارەی باوەڕ.**

پێغەمبەرمان ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی:

١- باوەڕ بهێنیت بە پەروەردگار. ٢- وە بە فریشتەكانی. ٣- وە پەرتووكەكانی. ٤- وە پێغەمبەرەكانی. ٥- وە بە ڕۆژی دوایی. ٦- وە باوەڕ بهێنیت بە قەدەر خۆشی و ناخۆشییەكانی.)

# واتای (لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ) چییە؟

**بە کورتی**

## واتە: هیچ پەرستراوێك نییە شایەنی پەرستن بێت جگە لە (الله).

**بە ڕوونی**

**ئەم وتەیە لە دوو بەش پێکهاتووە:**

**بەشی یەکەم: لَا إِلَهَ / واتە: هیچ پەرستراوێکی شایستە نییە.**
واتە: هیچ پەرستراوێك نییە کە شایستەی ئەوە بێت پەرستشی بۆ ئەنجام بدەیت.
وە بەم بەشە دەڵێن: **(نەفی کردن).**
چونکە: **تۆ نەفی هەموو پەرستراوێکی تر دەکەیت، وەك:** (پەیکەر - دار - بەرد - گۆڕ...هتد).

**بەشی دووەم: إِلَّا اللّٰه/** واتە: بێجگە لە (اللّٰه).
واتە: **(اللّٰه) بەتەنها شایستەی پەرستنە؛** چونکە: ئەو بەدیهێناویت و ڕزق و ڕۆزیت دەدات و ژیان و مردنی تۆی بە دەستە.
وە بەم بەشە دەڵێن: **(جێگیر کردن).**
چونکە: تۆ جێگیری دەکەیت کە (اللّٰه) پەروەردگاری شایستەیە، وە پەرستراوەکانی تر بەتاڵن.

**بەڵگە**

﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللهَ هُوَ الحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ هُوَ البَاطِلُ وَأَنَّ اللهَ هُوَ العَلِيُّ الكَبِيرُ﴾ [الحج: ٦٢]
واتە: بەڕاستی خوا خۆی حەق و ڕاستە، ئەوانەش کە ئەوان هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو هەر ئەوە خۆی بەتاڵ و ناحەقییە. بێگومان ئەو خوایە بڵندو بەرزو مەزن و گەورەیە.
﴿وَاعْبُدُوا اللهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا﴾[النساء:٤٨]
واتە: (ئەی خەڵکینە) تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.

﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوت﴾ [النحل: ٣٦]
واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر.

﴿وَمَا خَلَقْتُ الجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ [الذاريات: ٥٦]
واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزاد م دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوەنەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

﴿وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ﴾
واتە: فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن.

## ١ ویردی چوونە سەرئاو



کاتێك کە ویستت بچیتە سەر ئاو:

بڵێ :

((بِسْمِ اللّٰهِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ))

پاشان: بە پێی چەپت بڕۆرە ژوورەوە.

**بەڵگە**

(پەردەی نێوان چاوی جنۆکەکان و عەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیە کەوا یەکێکیان چووە سەر ئاو بڵێت: بسم الله)[ابن ماجة و الترمذي. صحيح الجامع: ٣٦١١]، وە فەرموودەی ئەنەس -رضي الله عنه- کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دەچووە سەرئاو دەیفەرموو: (اللَّهُم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث - واتە: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە نێرینە و مێیینەی شەیتانەکانی جنۆکە) [البخاري: ١٤٢ ، مسلم: ٣٧٥]

## ٢ ویردی هاتنە دەر لە سەرئاو



بە پێ ی ڕاستت بڕۆ دەرەوە و پاشان بڵێ:

((غُفْرَانَكَ))

**بەڵگە**

فەرموودەی عائیشە -رضي الله عنها- کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ لە سەرئاو دەهاتە دەرەوە دەیفەرموو: (غفرانك - واتە: ئەی خوایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم) [صحيح الجامع(٤٧٠٧)]

# مەرجەکانی دەستنوێژگرتن



## ١- شۆردنی هەموو ڕوخسار؛

لەبەر فەرمایشتی خوای پەروەردگار: (إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ -کاتێك هەستان بۆ نوێژکردن ڕوخسارتان بشۆن) [سورة المائدة, آية ٦] ، وە تێوەردانی ئاو لە دەم و لوت هەر لە شۆردنی ڕوخسارە.



## ٢-شۆردنی هەردوو دەست لەگەڵ ئانیشکەکان؛

لەبەر فەرمایشتی خوای پەروەردگار: (وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ - ودەستەکانتان تاوەکو ئانیشکەکانتان بشۆن) [سورة المائدة, آية ٦] .



## ٣- دەستهێنان بە هەموو سەردا لەگەڵ هەردوو گوێچکە؛

لەبەر فەرمایشتی خوای پەروەردگار: (وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ - وە دەستتان بهێنن بە سەرتاندا) [المائدة, ٦] ، وە لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (الأذنان من الرأس - هەردوو گوێ بەشێکن لە سەر) [الترمذي:٣٨ ، ابن ماجه: ٤٤٣ ، «السلسلة الصحيحة: ٣٦» ]



## ٤- شۆردنی هەردوو پێ لەگەڵ هەردوو قولە پێ؛

لەبەر فەرمایشتی خوای پەروەردگار: (وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ - وە هەردوو پێیەکانیشتان تاوەکو قولە پێکانتان بشۆن) [سورة المائدة, آية ٦].

## ٥- ڕیزبەندی؛ الترتيب

چونکە خوای گەورە بە ڕیزبەندی باسی ئەندامەکانی دەستنوێژی کردووە؛ وەپێغەمبەر ﷺ بەڕیز ئەندامەکانی دەستنوێژی دەشۆرد هەر وەك چۆن لە فەرموودەدا هاتووە (مسلم؛ ٢٣٥)
(١-ڕوخسار ٢- دەستەکان تاوەکو ئانیشك ٣- دەستهێنان بە سەر سەردا ٤- شۆردنی پێیەکان)

## ٦-بە دوای یەکتردا بوون بە بێ دواخستن؛ الموالاة

کاتێك ئەندامێکت دەشۆیت دەبێت ڕاستەوخۆ ئەندامی دوای ئەو بشۆیت و دوای نەخەیت ، چونکە کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی دەگرت و ئەندامێکی دەشۆرد شۆردنی ئەندامەکەی دوای ئەوی دوا نەدەخست.

## ١ نیەتی دەستنوێژگرتن بهێنە




کاتێك ویستت دەستنوێژ بگریت:
نیەت لە دڵی خۆت دا بهێنە.
وە بە زمان نیەت مەهێنە.
چونکە: جێگای نیەت دڵە.

**بەڵگە** لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (إنما الأعمال بالنيات - هەموو کردەوەکان بە نیەتەوە ئەنجام دەدرێن) . [البخاري ، مسلم]

## ٢ ناوی خوای گەورە بهێنە و دەستەکانت بشۆ




بڵێ: ((بسم اللّٰهِ))
واتە: بە ناوی خوا دەستنوێژ دەگرم.
وە دەستەکانت (٣ جار) بشۆ.

**بەڵگە** وتنی(بسم الله) واجبە ، لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ (لا وضوء لمن لم يذكر اسم الله عليه - دەسنوێژی ئەو کەسە تەواو نییە کە ناوی خوای لەسەر نەهێنابێت).
[احمد ، أبو داود ، الحاكم - وحسنه الألباني في «إرواء الغليل ١/١٢٢»]

## ٣ ئاو لە دەم و لوتت وەردە وفڕێی بدەوە

به دەستی ڕاست، ئاو له دەم و لوتت پێکەوە وەردە.
وە به دەستی چەپ ئاوەکە فڕێ بدرەوە. ( ٣ جار) ...





**بەڵگە**

(فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاثاً بِثَلاثِ غَرْفَاتٍ - پێغەمبەر ﷺ ئاوی وەردا له دەم و لوتی پێکەوە وە فڕێیدایەوە «٣ جار» ئەمەی دووبارە دەکردەوە بە سێ مشت)[البخاري(١٨٥) مسلم(٢٣٥)]

## ٤ ڕوخسارت بشۆ



ڕوخساری خۆت (٣ جار) بشۆ.

سنوری ڕوخسار(الوجه):

پانییەکەی : نێوان دوو گوێچکەکەکان
درێژیەکەی : لە شوێنی ڕووانی مووی سەر تا چەناگە.

بەڵگە (إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ -... ڕوخسارتان بشۆن)
[سورة المائدة, آية ٦]

## ٥ دەستەکانت بشۆ تا ئانیشکەکانت



دەستەکانت:
لە سەری پەنجەکانتەوە
تاوەکو ئانیشکەکانت (٣ جار) بشۆ.

(دەستی ڕاست پاشان دەستی چەپ)

بەڵگە (وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ – ودەستەکانتان تاوەکو ئەنیشکەکانتان بشۆن) .
(وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلاثًا -پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی تا ئانیشکەکانی (٣ جار) دەشۆرد).[البخاري(١٦٤)
مسلم(٢٢٦)]

## ٦ دەست بهێنە بەسەر سەرت دا






دەست بهێنە بەسەر سەرت دا:
لە دەسپێکی سەر تاوەکو پشتەمل.

وە (سوننەتە) جارێکیتر دەستەکانت
بگەڕێنیتەوە شوێنی دەسپێك.

**بەڵگە**
لەبەر فەرمایشتی خوای پەروەردگار: (وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ - وە دەست بهێنن بە سەر تاندا)[سورة المائدة، آية ٦]. **مەسح کرنی بەشێك لە سەر دروست نییە؛ دەبێت هەموو سەری خۆت مەسح بکەیت.**

## ٧ دەست بهێنە بە گوێچکەکانت دا





دەست بهێنە بە گوێچکەکانتدا بەو ئاوەی
کە بە دەستتەوە ماوەتەوە.

بە هەردوو پەنجەی شایەتومان ناوەوەی
هەردوو گوێت مەسح بکە.
بە پەنجە گەورەکانت دەرەوەی گوێت
مەسح بکە.

**بەڵگە**
لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ : (الأذنان من الرأس - هەردوو گوێ بەشێکن لە سەر)
[الترمذي:٣٨ ، ابن ماجه: ٤٤٣ ، صححه الالباني في«السلسلة الصحيحة: ٣٦» ].

## ٨ پێیەکانت بشۆ




**پێیەکانت:**
لە سەری پەنجەکانتەوە
تاوەکو قولە پێت (٣جار) بشۆ.

(پێ ی ڕاست پاشان پێ ی چەپ)

**بەڵگە** | (غَسَلَ كِلْتَا رِجْلَيْهِ ثَلاثًا - پێغەمبەر ﷺ (٣ جار) هەردوو پێیەکانی دەشۆرد). [البخاري(١٦٤) مسلم(٢٢٦)]

## ٩ ویردی دوای دەستنوێژ




کاتێك کە لە دەستنوێژ تەواو دەبیت،
بڵێ:

((أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ
وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي
مِنَ التَّوَابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ))

**بەڵگە** | [مسلم (٢٣٤) ،و زاد الترمذي (اللَّهُم اجعلني..) (صححه الألباني في «الإرواء ٩٦»)

## ١ کەی تەیەمموم دەکەیت؟



کاتێك:
١- ئاوت دەست نەکەوت،
یان
٢- ئاو هەبوو بەڵام بەکارهێنانی زیانی پێ گەیاندیت،
ئەوکات تەیەمموم بکە.

**بەڵگە** (وَإِنْ كُنْتُم مَرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا- ئەگەر نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یان یەکێك لە ئێوە لە سەرئاوەوە هات یان چوونە لای خێزانتان ، وە ئاوتان دەست نەکەوت ئەوکاتە تەیەمموم بکەن) [سورة المائدة, آية ٦]

## ٢ نیەتی تەیەمموم بهێـنە

نیـەت

نیەتی تەیەمموم بهێـنە لە دڵی خۆت دا لە بری ئەو شتەی کە تەیەممومی لەجێگا دەکەیت؛ کە بریتییە لە:
١- دەستنوێژگرتن.
٢- خۆ شۆردن.

**بەڵگە** لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (إنما الأعمال بالنيات - هەموو کردەوەکان بە نیەتەوە ئەنجام دەدرێن) . [البخاری ، مسلم]

## ٣ دەستەکانت لە ڕووی زەوی بدە



دەستەکانت لە ڕووی زەوییەکی پاك بدە.
ئەگەر خاکت دەست نەکەوت ئەوکات هەر شوێنێکی تر کە خۆڵی پێوەبێت.

**بەڵگە** | (فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا - بە ڕووی زوییەکی پاك تەیەمموم بکە) [سورة المائدة, آية ٦]

## ٤ دەست بهێنە بە ڕوخسار و دەستەکانتدا



ڕوخسارت؛ وە پاشان
هەردوو دەستتەکانت؛
بەو خۆڵە مەسح بکە.

(دەستی ڕاست پاشان دەستی چەپ).

**بەڵگە** | (فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ -(لەپی دەستتان بدەن بەخاکەدا) و بیهێنن بە ڕوخسار و دەستتاندا)
[سورة المائدة, آية ٦]

## ١ نوێژ چییە؟




نوێژ: پەرستشێکە لە چەند وتە و کردەوەیەك پێکدێت.
بە تەکبیر دەستپێدەکات و بە سەلام دانەوە کۆتایی پێدێت.

## ٢ خۆت پاك بکەوە



ئەگەر ویستت نوێژ بکەیت:

١- دەستنوێژ بگرە.

(کاتێك دەستنوێژت نەبوو).

٢- خۆت بشۆ.

(ئەگەر لەشگرانبوویت).

بەڵام:

ئەگەر: ئاوت دەست نەکەوت ، یان بەکارهێنانی زیانت پێبگەیەنێت؛ تەیەممو بکە.

بەڵگە | لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە لە ئایەتی (٦)ی سورەتی (المائدة).

## ٣ با جێگای نوێژەکەت پاك بێت



جێگای خۆت پاك بکەوە

١ -(جل وبەرگ) و ٢ -(جێگا)ی نوێژەکەت پاك بکەرەوە.

**بەڵگە**

لەبەر فەرمایشتی خوای پەروەردگار: (وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ - پۆشاکەکەت خاوێن ڕابگرە) [سورة المدثر]
وە لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (أريقوا عليه سجلا من الماء -کاتێك دەشتەکییەك لە مزگەوت میزی کرد- پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:سەتڵێك ئاوی پێدا بڕێژن ) [الدارقطني: ٤٥٣، صحح الالباني الإرواء:٢٨٠]

## ٤ ڕوو بکەرە قیبلە



قیبلە

ڕوو بکەرە قیبلە - ئەو شوێنەی کە موسوڵمانان لە کاتی نوێژدا ڕووی تێدەکەن کە بریتییە لە کەعبەی پیرۆز- بەبێ ڕوو وەرگێڕان.

**بەڵگە**

لەبەر فەرمایشتی خوای پەروەردگار: (فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ - ڕوو بکەرە کەعبەی پیرۆز) ،
وە لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (إذا قمت إلى الصلاة فأسبغ الوضوء، ثم استقبل القبلة - کاتێك ویستت نوێژبکەیت بەجوانی دەستنوێژ بگرە ، پاشان ڕوو بکەرە قیبلە) (البخاري ٦٢٥١ مسلم ٣٩٧).

## ٥ نیەتی نوێژ بهێنە

نیەت

لە دڵی خۆت دا نیەتی ئەو نوێژە بهێنە كە دەتەوێت بیكەیت.
بە زمان نیەت مەهێنە.
چونكە جێگای نیەت دڵە نەك زمان.

**بەڵگە** | لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (إنما الأعمال بالنيات - هەموو كردەوەكان بە نیەتەوە ئەنجام دەدرێن) [البخاری ، مسلم]، وە نابێت نیەت بە زمان بهێنیت، تەنها بەدڵ بیرت لای ئەوە بێت كە نوێژ دەكەیت.

## ٦ تەكبیر بكە




تەكبیرەی نوێژ دابەستن بكە و بڵێ:

(اللَّهُ أَكْبَرُ)

**بەڵگە** | لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (إذا قمت إلى الصلاة فكبر - كاتێك ویستت دەست بە نوێژ بكەیت: «الله أكبر» بكە) [البخاري(٧٩٣) مسلم(٣٩٧)] (تحريمها التكبير وتحليلها التسليم - بە تەكبیرەی نوێژ دابەستن ئەو كردەوانەی كە لە دەرەوی نوێژدا ڕێگەپێدراون قەدەغە دەكرێن ، وە بە سەلام دانەوە ئاسایی دەبنەوە) [صحيح سنن ابن ماجه (٢٢٤)].

## ٧ دەستەکانت بەرز بکەرەوە



لەگەڵ (اللّٰهُ أَكْبَرُ) دەستەکانت بەرز بکەوە بە هاوتای شانت یان گوێچکەت.

وە بڕوانە شوێنی سوجدەکەت.
وە پێیەکانت بە فراوانی هەردوو شانت بکەرەوە.

**بەڵگە** لەبەر کردەی پێغەمبەر ﷺ :(أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ)(البخاري٧٣٨)
(فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا بِأُذُنَيْهِ)[مسلم ٤٠١ ، أبو داود ٩٥٧]

## ٨ دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ دابنێ



دەستت لەسەر سنگت دابنێ:

دەستی ڕاستت لەسەر دەستی چەپت دابنێ.

**بەڵگە** (وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى - چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ناو نوێژ دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دادەنا)[مسلم ٤٠١]

## ٩ نزای دەسپێك بخوێنە

نزای دەسپێك



بڵێ: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ)).

یان بڵێ : ((اللهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ المَشْرِقِ وَالمَغْرِبِ ، اللهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ ، اللهُمَّ اغْسِل خَطَايَايَ بِالمَاءِ وَالثَّلجِ)).

[البخاري (٧٤٤) مسلم (٥٩٨)]
[سنن الترمذي (٢٤٢)سنن النسائي (٨٩٩ ، ٩٠٠)سنن ابن ماجه (٨٠٤) صححه الالباني. صحيح أبي داود (٧٤٩)]

**بەڵگە**

سوننەتە لە دوای تەکبیرەی ئیحرام و پێش خوێندنی سورەتی (الفاتحة) یەکێك لەم نزایانە بخوێنرێت.

## ١٠ سورەتی (الفاتحة) بخوێنە

سورة الفاتحة

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١
ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢
ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤
إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥ ٱهۡدِنَا
ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ
عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ
وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧

بڵێ : أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ
(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (١) الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ.....).
پاشان سورەتێکی تر بخوێنە وەك:
(قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ (١) اللهُ الصَّمَدُ (٢)..).

**بەڵگە**

خوای گەورە دەفەرموێت:
(( فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ - کاتێك قورئانت خوێند پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو وبڵێ: (أعوذ باللهِ من الشيطان الرجيم). ))[سورة النحل ٩٨]
وە لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ :(لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ - نوێژی ئەو کەسە دروست نییە کە سورەتی (الفاتحة)ـی تێدا نەخوێنێت) [البخاري ٧٦٥ مسلم ٣٩٤] ، وە (ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ -هێندەی بۆت گونجا لە قورئان بیخوێنە) [البخاري ٧٢٢ مسلم ٣٩٢]



## ١١ ڕکوع ببە




بڵێ: (اللّهُ أَكْبَرُ) وە لەگەڵ -اللّهُ أَكْبَرُ-دا هەردوو دەستەکانت بەرزبکەرەوە ، وە پەنجەکانت بە ڕاستی بگرە و بڵاویان مەکەرەوە.

پاشان بچۆرە ڕکوع : پشتت بچەمێنەرەوە ، وە سەرت لە ئاستی پشتت ڕابگرە.

وە دەستەکانت لەسەر ئەژنۆت دابنێ هەر وەك ئەوەی ئەژنۆکانت بگریت.

وە پەنجەکانت بڵاوبکەرەوە.

وە (٣ جار) بڵێ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيم» .

**بەڵگە**

لەبەر کردەی پێغەمبەر ﷺ :(وَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ - کاتێك پێغەمبەر ﷺ بچوایەتە ڕکوع بەباشی دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی دادەنا ، وە پشتی دەچەماندەوە )[البخاري ٨٢٨]

(وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ، وَلَمْ يُصَوِّبْهُ، وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ - کاتێك پێغەمبەر ﷺ چووبایەتە ڕکوع سەری بەرز نەدەکردەوە و نزمیشی نەدەکردەوە بەڵکو لە نێوانیاندا ڕایدەگرت)[مسلم ٤٩٨]

(فوضع يديه على ركبتيه كأنه قابض عليهما - دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی دادەنا ، هەر وەکو ئەوەی بیانگرێت.)[صححه الألباني: جامع الترمذي ٢٦٠] (يقُولُ إِذَا رَكَعَ « سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ » ثَلَاثَ مَرَّاتٍ) [ابن ماجه ٨٨٨ «صحيح ابن ماجه ٧٢٥»]

## ١٢ هەستەوە لە ڕکوع




کاتێك هەستایتەوە لە ڕکوع بڵێ:
(سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ).

وە جارێکی تر دەستەکانت بەرز بکەرەوە بە هاوتای شانت یان گوێچکەت.

پاشان پشتت ڕاست بکەرەوە.

وە بڵێ: (رَبنَا وَلَكَ الْحمد).

**بەڵگە**

(وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ أَيْضًا - کاتێك پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکوع دەستەکانیشی بەرزدەکردەوە)[البخاري ٧٣٥]

(فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَهُ - کاتێك پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز دەکردەوە -لە ڕکوع- پشتی ڕاست دەکردەوە هەتاوەکو بڕبڕەکانی پشتی دەگەڕانەوە جێگای خۆیان ) [البخاري ٨٢٨]

(حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ يَقُولُ : « سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ » )[البخاري ٨٠٤]

## ١٣ سوجدە ببە




بڵێ: (اللّٰهُ أَكْبَرُ) و سەرت لەسەر ڕووی زەوی دابنێ.

- دەبێت (حەوت) ئەندامی لاشەت لەسەر زەوی دابنێیت.

(ناوچاوان و لوت پێکەوە - هەردوو دەست - هەردوو ئەژنۆ - هەردوو پێ)

- پەنجەکانی دەستت بڵاو مەکەرەوە و ڕوویان بکەرە قیبلە.
- دەستەکانت لە ئاستی شانت دابنێ یان لە ئاستی گوێچکەکانت.
- ئانیشکت لەسەر زەوی دامەنێ.
- هەردوو پێیەکانت بەیەکەوە بلکێنە ، وە پەنجەکانی پێت ڕوو بکەرە قیبلە.
- (٣ جار) بڵێ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى).

**بەڵگە**

لەبەر کردە و فەرمایشتی خۆشەویستمان ﷺ:

(فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ، وَلَا قَابِضِهِمَا وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِ رِجْلَيْهِ الْقِبْلَةَ - کاتێك پێغەمبەر ﷺ سوجدەی ببردایە، دەستی خۆی لە سەر زەوی دادەنا وە پەنجەکانی بڵاو نەدەکردەوە و دەستیشی دانەدەخست ، وە سەری پەنجەکانی پێ ی ڕوو دەکردە قیبلە) [البخاري ٨٢٨]

(وَيَنْهَى أَنْ يَفْتَرِشَ الرَّجُلُ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ السَّبُعِ - پێغەمبەر ﷺ ڕێگری دەکرد کە نوێژخوێن دەستەکانی ڕابخات وەک ڕاخستنی دڕندە)[مسلم ٤٩٨]

(أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ : عَلَى الْجَبْهَةِ - وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ - وَالْيَدَيْنِ، وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ، وَلَا نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَالشَّعَرَ– فەرمانم پێکراوە کە لەسەر حەوت ئەندام سوجدە ببەم ...). [البخاري ٨١٢ مسلم ٤٩٠]

(وَإِذَا سَجَدَ قَالَ : « سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى »، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ) [ابن ماجه ٨٨٨ «صحيح ابن ماجه ٧٢٥»]

## ١٤ نێوان هەردوو سوجدە




بڵێ: (اللّهُ أَكْبَرُ)، وە هەستەوە لە سوجدە.
پێی چەپت ڕابخە و لەسەری دابنیشە.
وە پێی ڕاستت بچەقێنەرە زەوی،وە پەنجەکانی ڕوو بکەرە قیبلە.
وە بڵێ: (رَبِّ اغْفِرْ لِي رَبِّ اغْفِرْ لِي).
جارێکی تر بڵێ: (اللّهُ أَكْبَرُ) و سوجدەی (دووەم) ببە.

**بەڵگە** | (أن النبي صلى اللهُ عليه وسلم كان يقول بين السجدتين: ( رَبِّ اغْفِرْ لِي رَبِّ اغْفِرْ لِي ) – پێغەمبەر ﷺ لە نێوان هەردوو سوجدەکەدا دەیفەرموو:( رَبِّ اغْفِرْ لِي رَبِّ اغْفِرْ لِي ) ). [( صحيح ) الارواء ٣٣٥ ابن ماجه ٨٨٨]

## ١٥ ڕکاتی (دووەم) بکە




بڵێ : (اللّهُ أَكْبَرُ) وە هەستەوە؛ وە ڕکاتی (دووەم) بکە هەر وەك ڕکاتی (یەکەم).

**بەڵگە** | (ثُمَّ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا - پاشان پێغەمبەر ﷺ هەمان کاری ئەنجام دەدایەوە هەتاوەکو نوێژەکەی کۆتایی پێدەهێنا). [البخاري ٧٨٩]

## ١٦ تەحیات بخوێنە




لە دوای ئەوەی سوجدەی (دووەم) دەبەیت لە ڕکاتی (دووەم) دابنیشە لەسەر پێی چەپت بە ڕاخراوی،وە پێی ڕاستت بچەقێنەرە زەوی بەهەمان شێوازی دانیشتنی نێوان دوو سوجدەکە.

تەحیات بخوێنە و بڵێ:

(التَّحِيَّاتُ لِلهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ ؛ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ) [البخاري ٨٣١]

(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)[البخاري ٣٣٧٠]

**بەڵگە** | (وَكَانَ يَقُولُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ : التَّحِيَّاتُ. وَكَانَ إِذَا جَلَسَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى - پێغەمبەر ﷺ لەهەموو دوو ڕکاتێکدا تەحیاتی دەخوێند، وە کاتێك کە دادەنیشت پێی چەپی ڕادەخست، وە پێی ڕاستی دەچەقاندە زەوی)[مسلم ٤٩٨]

## ١٧ ڕکاتی (٣ و ٤) بکە

ڕکاتی سێیەم و چوارەم

لەدوای ئەوەی کە تەحیاتی یەکەم دەخوێنیت هەستەوە و بڵێ:(اللّٰهُ أَكْبَرُ).
وە دەستەکانت بەرزبکەرەوە و ڕکاتی (٣ و٤) بکە وەکو ڕکاتەکانی تر.

وە دەشتوانیت لە ڕکاتی (٣ و٤) جار جار لەدوای سورەتی (الفاتحة) سورەتێکی تر بخوێنیت.

**بەڵگە** | (ثُمَّ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا - پاشان پێغەمبەر ﷺ هەمان کاری دەکرد هەتاوەکو نوێژەکەی کۆتایی پێدەهێنا). [البخاري ٧٨٩]

## ١٨ تەحیاتی کۆتایی بخوێنە

تەحیاتی کۆتایی



دوای ئەوەی سوجدەی (دووەم) دەبەیت لە ڕکاتی (چوارەم) دابنیشە بەشێوازی تەوەڕوك هەروەك چۆن ئاماژەی پێدەکەین.

وە تەحیات بخوێنە.

وە ئەم نزایەشی بۆ زیادبکە:

(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ).

دوای هەموو تەحیاتێکی کۆتایی: ئەم نزایە لە بیرمەکە چونکە: واجبە بیخوێنیت.

**بەڵگە** | لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللّٰهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ : اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)[البخاري ١٣٧٧ مسلم ٥٨٨]

## ١٩ بە شێوازی تەوەڕوك دابنیشە



ئەو نوێژەی دوو تەحیاتی تێدایە، وەك: (نیوەڕۆ - عەسر - ئێوارە - خەوتنان) دەتوانیت شێوەدانیشتنی (تەوەڕوك) لە تەحیاتی کۆتایی دا بەکاربهێنیت.

شێوازەکەی: پێی ڕاستت دەچەقێنیت، وە پێی چەپت دەخەیتە ژێر پێ ی ڕاستت .

**بەڵگە** | لەبەر کردەی پێغەمبەر ﷺ:(وَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ ) [البخاري ٨٢٨]

(حَتَّى إِذَا كَانَتِ السَّجْدَةُ الَّتِي فِيهَا التَّسْلِيمُ أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَقَعَدَ مُتَوَرِّكًا عَلَى شِقِّهِ الْأَيْسَرِ. قَالُوا : صَدَقْتَ، هَكَذَا كَانَ يُصَلِّي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.) [صحيح سنن أبي داود ٧٣٠]

## ٢٠ چۆنیەتی دانیشتنت لە تەحیات




لەو کاتەی کە تەحیات دەخوێنیت:
دەستی ڕاستت لەسەر ڕانی ڕاستت دابنێ.
وە دەستی چەپت لەسەر ڕانی چەپت دابنێ.
وە پەنجەکانی دەستی چەپت تەخت بکە، وە پەنجەکانی دەستی ڕاستت بنوشتێنەرەوە جگە لە پەنجەی شایەتومان.
کاتێك کە تەحیات دەخوێنیت سەیری پەنجەی شایەتومانت بکە و پەنجەی شایەتومان بەرزبکەرەوە.

**بەڵگە**

(أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ، وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ الْيُمْنَى الَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ، فَدَعَا بِهَا، وَيَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى بَاسِطَهَا عَلَيْهَا)[مسلم ٥٨٠]

(فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ الَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ فِي الْقِبْلَةِ، وَرَمَى بِبَصَرِهِ إِلَيْهَا أَوْ نَحْوِهَا، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ.) [قال الألباني: «حسن صحيح» في صحيح سنن النسائي ١١٦٠]

## ٢١ سەلام بدەوە




لە دوای ئەوەی کە تەحیاتی کۆتاییت خوێند، سەلام بدەرەوە.
سەرەتا: بەلای ڕاستدا سەلام بدەرەوە و بڵێ:
(السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ).
پاشان: بەلای چەپدا سەلام بدەرەوە و بڵێ:
(السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ).

**بەڵگە**

(وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلَاةَ بِالتَّسْلِيمِ - پێغەمبەر ﷺ بە سەلام دانەوە کۆتایی بە نوێژ دەهێنا) [مسلم ٤٩٨]

(كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْنَا : السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ)[مسلم ٤٣١]

(كُنْتُ أَرَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ، حَتَّى أَرَى بَيَاضَ خَدِّهِ) [مسلم ٥٨٢]

## تەکبیر

### شێوازی دروست



### شێوازی هەڵە



# قیام

## شێوازی دروست



## شێوازی هەڵە






## ڕکوع

### شێوازی دروست





### شێوازی هەڵە









# دانیشتن

## شێوازی دروست



## شێوازی هەڵە



## سەلام دانەوە

### شێوازی دروست



### شێوازی هەڵە





# ناوەڕۆك

## دەسپێك

دەسپێك



## بەشی یەکەم

چوونە سەرئاو



## بەشی دووەم

دەستنوێژ



## بەشی سێیەم

تەیەمموم



## بەشی چوارەم

نوێژ

هەڵە باوەکان

## بەشی پێنجەم



تم بحمدالله وفضله

رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ
عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا
تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآۚ
أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ